# لە سەلەفی ساڵحەوە

## چەند وەسیەت و ڕاسپاردەیەک

## بۆ گەنجان



وەرگێڕانی

دایکی خوبەیب

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: " لە سەلەفی سالحەوە چەند وەسیەت و ڕاسپاردەیەك بۆگەنجان "
نووسینی: " عبدالرزاق بن عبد المحسن العباد البدر "
وەرگێڕانی: " دایکی خوبەیب "
نەخشەسازی ناوەوە: " عبدالله خاکی "
نەخشەسازی بەرگ: " اخلاص دیزاین "
نۆرە و ساڵی چاپ: " یەکەم: ١٤٤٢ کۆچی - ٢٠٢١ میلادی "

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «  »ی ساڵی «٢٠٢٠»ی پێ دراوە.

﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ۲۰ النحل

به‌ڕاستی ئیبراهیم علیه السلام هه‌ر خۆی ئومه‌تێك بوو، هه‌ر خۆی پێشه‌وایه‌ك بوو ملكه‌چ و فه‌رمانبه‌رداری اللَّه بوو و له‌ هه‌موو بیرو باوه‌ڕێكی چه‌وت به‌ دوور بوو، له‌ موشریك و هاوه‌ڵگه‌رانیش نه‌بوو...




# پێشەکی نووسەر

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله رب العالمين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلى الله عليه وسلم وعلى آله وصحابه أجمعين.** أمابعد:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری گشت جیهانیان، وە شایەتی دەدەم بەوەی کەوا هیچ خوایەک نییە کە شایستەی پەرستن بێت بەهەق جگە لە اللهی تاک و تەنیا وە هیچ هاوەڵێکیشی نییە، وە شایەتی دەدەم کەوا محمد ﷺ بەندە و پێغەمبەری اللهیە، درود سەلامی اللهی لەسەر بێت لەگەڵ گشت ئال و بەیت و هاوەڵەکانی.

لەپاشاندا:

**فلا يخفى أن مرحلة الشباب مرحلة مهمة جدا في حياة الإنسان، لأنها مرحلة القوة والنشاط، وسهولة الحركة، وقوة الأعضاء، وسلامة الحواس، بينما إذا كبر الإنسان تضعف منه حواسه وقواه.**

جا ناشاردرێتەوە کە قۆناغەکانی گەنجیەتی قۆناغێکی زۆر گرنگە لەژیانی مرۆڤ. چونکە ئەوە قۆناغی هێز و توانا و چالاکیە، وە ئاسانی جموجوڵ و بزەوتنە، وە تواناو هێزی ئەندامەکانی لاشەیە، وە ساغ و سەلامەتی هەستەکانە، لە کاتێکدا ئەگەر مرۆڤ تەمەنی گەورە بوو ئەوا هێز و توانا و هەستەکانی لاواز دەبێت.



**وقد أولى الإسلام هذه المرحلة اهتماما خاصا، ورعاية عظيمة، وجاءت النصوص مؤكدة على عظم شأن هذه المرحلة وأهميتها، وقد حث نبينا ﴿ﷺ﴾ على المبادرة لإغتنامها، و الحذر من إضاعتها.**

وە ئیسلام ئەم قۆناغەی لە پێشینە داناوە گرنگیەکی تایبەتی پێداوە، وە چاودێریەکی زۆر گەورەی لەسەردا ناوە، وە لە بنچینە و ناوەڕۆکی دڵنیا کەرەوەکان هاتووە لەبارەی گەورەیی ئەم قۆناغە و گرنگیەکەی، وە هەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هاندەربووە لەسەر دەست پێشخەری کردن و بەدەست هێنانی، وە هۆشداری داوە کە ئەم قۆناغە لە دەست خۆمان نەدەین.

**فعن ابن عباس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله ﴿ﷺ﴾ لرجل وهو يعظه: (اغتنم خمسا قبل خمس: شبابك قبل هرمك، وصحتك قبل سقمك، غناك قبل فقرك، وفراغك قبل شغلك، وحياتك قبل موتك)**[1]

جا لە ابن عباسەوە (الله لێی ڕازی بێت) گوتوویەتی: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئامۆژگاری پیاوێکی دەکرد فەرمووی: پێنج شت پێش پێنج شت بەدەست بهێنە و لەدەست خۆتی مەدە: گەنجیەتیت پێش پیریت، وە لەش ساغیت پێش نەخۆشیت، وە دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت، وە دەست بەتاڵیت پێش سەرقاڵیت، وە ژیانت پێش مردنت.

---

[1] - أخرجه الحاكم في (المستدرك) رقم (٧٨٤٦)،وصححه،ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في ((صحيح الجامع)) (١٠٧٧).



**فمرحلة الشباب داخلة في عموم قوله ﴿ﷺ﴾ (وحياتك قبل موتك)، لكنه ﴿ﷺ﴾ خص هذه المرحلة بالذكر لعظم أهميتها وكبير شأنها، فينبغي التيقظ لذلك وعدم التهاون بها.**

جا قۆناغی گه‌نجیشی تێكرِا له‌خۆ گرتووه له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ (وه‌ژیانت پێش مردنت) به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ ئه‌م قۆناغه‌ی تایبه‌ت كردووه به باسكردن به هۆی گرنگیه‌كه‌ی و گه‌وره‌یی پله‌و پایه‌كه‌ی، جا ده‌بێت ئاگاداری بیت و به‌سوك و كه‌می سه‌یری نه‌كه‌یت.

**وعن ابن مسعود رضي الله عنه أن النبي ﴿ﷺ﴾ قال: (لاتزول قدم ابن آدم يوم القيامة من عند ربه حتى يسأل عن خمس عن عمره فيم أفناه، وعن شبابه فيم أبلاه، وماله أين اكتسبه وفيم أنفقه، وماذا عمل فيما علم)[1]**

وه له ابن مسعوده وه (الله لێی ڕازی بێت) كه پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ فه‌رموویه‌تی: قاچی نه‌وه‌ی ئاده‌م له‌ڕۆژی قیامه‌ت له‌لای په‌روه‌ردگاری له‌شوێنی خۆی ناجوڵێت و ناترازێت تاوه‌كو پێنج پرسیاری لێ نه‌كرێت له‌باره‌ی پێنج شت: له ته‌مه‌نی كه له‌چی به‌سه‌ری برد، وه چی به‌سه‌ر گه‌نجیه‌تیداهێنا له‌چی تاقی كرده‌وه، وه ماڵ و سامانی له كوێی به‌ده‌ست خست و له‌چیدا خه‌رجی كرد، وه‌چ كارێكی ئه‌نجامدا به‌وه‌ی كه وا فێری بوو.

---

[1] - أخرجه الترمذي برقم (٢٤١٦) ،وصححه الألباني في _الصحيحة_ (٩٤٦)

**الأول: عن حياته عموما، من أولها إلى آخرها.**

سه‌ره‌تا: له‌باره‌ی ژیانی به‌تێكڕایی، له‌سه‌ره‌تایی تا كۆتایی.

**الثاني: عن مرحلة الشباب خصوصا، مع أنه إذا سئل عن حياته فإن مرحلة الشباب داخلة فيها، لكنه يسأل يوم القيامة عنها سؤالا خاصا.**

وه دووه‌م: به‌تایبه‌تی له‌باره‌ی قۆناغی گه‌نجیه‌تی، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه‌وا ئه‌و پرسیاری لێ كرا له باره‌ی ژیانی ئه‌وه قۆناغی گه‌نجیه‌تیشی له‌خۆ گرتووه، به‌ڵكو له ڕۆژی دوایی پرسیاری تایبه‌تی له‌باره‌وه ده‌كرێت.

**ولهذا ينبغي على الشاب أن ينتبه لأهميةهذه المرحلة، ويتذكر دائما أن ربه عز وجل سيسأله يوم القيامة ماذا عمل فيها، إضافة إلى السؤال عن عمله في عمره كله المتضمن لمرحلة الشباب، لأنها مرحلة القوة والنشاط، ويسر الحركة، وقوة الأعضاء وإكتمال الحواس .**

وه له‌به‌ر ئه‌وه پێویسته له‌سه‌ر گه‌نج وریای گرنگی ئه‌م قۆناغه بێت، وه به‌رده‌وام بێنێته یادی خۆی كه الله تعالى له ڕۆژی دوایی پرسیاری لێ ده‌كات كه چ كارو كرده‌وه‌یه‌كی تێدا ئه‌نجام داو، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی پرسیاری لێ ده‌كرێت له‌باره‌ی ئه‌و كاروكرده‌وانه‌ی كه له ته‌واوی ته‌مه‌نیدا ئه‌نجامیداوه قۆناغی گه‌نجیشی له ناوه خۆی گرتووه، چونكه ئه‌وه قۆناغی هێزو تواناو چوست و چالاكیه، وه به ئاسانی جموجوڵه و بزه‌وتنه، وه هێزو توانای ئه‌ندامه‌كانی لاشه‌یه، وه بێ كه‌م و كوڕی و ساغی هه‌سته‌كانه.

**ولهذا حث النبي ﴿ﷺ﴾ الشباب _ كما في الحديث السابق _ على اغتنام هذه المرحلة، اغتناما عظيما.**

وە بۆیە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ گەنجانی لەسەر هانداوە _ وەکو لە فەرموودەکەی پێشو باسمان کرد.

لەسەر بەدەست هێنان و لەدەست نەدانی ئەم قۆناغە، بە دەستهێنانێکی زۆر گەورە.

**وأوصى ﴿ﷺ﴾ أيضا أهل العلم والمعتنين بالتربية والدعوة والتعليم بالشباب، لأن الشاب يحتاج إلى عناية وملاطفة، ورفق وتودد، وتحبيب له في الخيروأهله، حتى لا يتخطفه أهل الباطل وأرباب المحرمات.**

وە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوانەشی ڕاسپاردووە کە خاوەنی زانست و خەمخۆران و گرنگی پێدەرانی پەروەردە و بانگخوازان و ئەوانەی کە گەنجان فێری زانست و زانیاری دەکەن، چونکە گەنجان پێویستیان بە گرنگی پێدان و سۆزو میهرەبانیە، وە نەرم و نیانی و خۆشەویستیە، وە خێر و چاکە و چاکەکارانیشی لا خۆشەویست بکەی، تاوەکو ئەو خەڵکانەی لەسەر باتڵ و ناڕەوان و حەز و داواکاری قەدەغەکراوەکانە گەنجەکان نە ڕفێنن بۆ لای خۆیان.



**ولهذا حرص الصحابة (رضي الله عنهم) على تحقيق هذه المعاني الجليلة كما جاء عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه أنه كان إذا رأى الشباب قال: (مرحبا بوصية الرسول ﴿ﷺ﴾ أوصانا رسول الله ﴿ﷺ﴾ أن نوسع لكم في المجالس، وأن نفهمكم الحديث، فإنكم خلوفونا وأهل الحديث بعدنا)**

هەر بۆیەش هاوەڵان (اللە لێیان ڕازی بێت) زۆر سوربوون لەسەر ئاشکراکردنی ئەم مانا شکۆدارانە وەک چۆن هاتووە لە ئەبو سەعیدی خدری (اللە لێی ڕازی بێت) ئەو کاتێک گەنجێکی دەبینی دەیگووت: بەخێر بێت بۆ وەسیەت و ڕاسپاردەی پێغەمبەری اللە ﴿ﷺ﴾ ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەسیەتی بۆتان کردووە ڕایسپاردووین کە دانیشتن و کۆڕەکانتان بۆ فراوان بکەین، وە فەرموودەتان تێ بگەینین چونکە ئێوە جێگرەوەی ئێمەن خەڵکی فێری زانست و زانیاری دەکەن لە دوای ئێمە، وە خاوەنی فەرموودەن لەدوای ئێمە.

**وكان يقبل على الشاب فيقول له ( يا ابن أخي، إذا شككت في شيء فسلني حتى تستيقن، فإنك إن تنصرف على اليقين أحب إلي من أن تنصرف على الشك )[1]**

وە کاتێک بە ڕەو ڕووی گەنج دەهات جا پێی دەگووت: ئەی برازاکەم، ئەگەر گومانت لە شتێک هەبوو ئەوە پرسیارم لێ بکە تاوەکو دڵنیا دەبیتەوە و گومانت نامێنێت، چونکە ئەگەر تۆ بە دڵنیاییەوە بێ شک و گومان ئێرە بەجێ بهێڵی لام خۆشەویستترە لەوەی کە بە شک و گومانەوە ئێرە جێ بهێڵی.

---

[1] - أخرجه البيهقي في كتابه (شعب الإيمان) برقم (١٦١٠).



**وكان عبد الله بن مسعود رضي الله عنه إذا رأى الشباب يطلبون العلم قال: (مرحبا بينابيع الحكمة ومصابيح الظلم، خلقان الثياب، جدد القلوب، حلس البيوت، ريحان كل قبيلة)[1]**

وه عبدالله ابن مسعود (الله لێی ڕازی بێت) ئەگەر گەنجانی ببینی با کە داوای زانست و زانیاری دەکەن دەیگووت: (بەخێر بێت لە هەڵقوڵاوی سەرچاوەکانی ژیری و دانایی وە چراکانی تاریکی، وە جل و بەرگ دڕاوە هەژارەکان،نوێکەرەوەی دڵەکان، ڕاخەر و پەیوەست بوون بە ماڵەکان، وە گوڵی بۆنخۆشی خێڵ و هۆزەکان.

جل و بەرگە دڕاوەکان مەبەستی ئەوەیە کە لەسەر زەوی جل و بەرگیان دڕاو و هەژارن بەڵام لەلای الله ناسراون و ڕێزدارن، مەبەستی لە ڕاخەری ماڵەکان ئەوەیە کە لە سەردەمی فیتنە واباشە گەنج زۆر نەچێتە دەرەوە پێویستە گەنج کاتەکانی لە ماڵ بەسەر ببات بۆ ئەوەی سەلامەت بێت و دوور بێت لە فیتنە.

**ووصايا السلف رحمهم الله للشباب وعنايتهم بهذه المرحلة كثيرة جدا، وفي هذه الرسالة (من وصايا السلف للشباب) انتقيت جملة منها، مع تعليق يسير على كل وصية.**

وه وەسیەت و ڕاسپاردەکانی پێشینە چاکەکانی سەلەفی سالح (ڕەحمەتی الله یان لێ بێت) بۆ گەنجان وە گرنگی پێدانیان بۆ ئەم قۆناغە زۆر زۆرە، وە لەم پەیامە ( لە وەسیەت و ڕاسپاردەکانی سەلەف بۆ گەنجان ) چەند ڕستەیەکم لێ دیاری کردووە، لەگەڵ کەمێک ڕوونکردنەوە لەسەر هەر وەسیەت و ڕاسپاردەیەک.

[1] - أخرجه ابن عبد البر في (جامع البيان العلم وفضله) برقم (٢٥٦).

# پێشه‌کی وه‌رگێڕ

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا و سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .**

الحمدلله سوپاس و ستایشی الله تعالى ده‌كه‌م كه‌ جارێكی تر فه‌زڵی ئه‌وه‌ی پێ به‌خشیم كه‌ بتوانم نامیلكه‌یه‌كی تر وه‌ربگێڕمه‌ سه‌ر زمانی كوردی بۆ ئه‌وه‌ی گه‌نجه‌كانمان سوودی لێ وه‌ربگرن و ببێته‌ مایه‌ی ڕێنموونی و سه‌رفرازیان له‌ دونیا و قیامه‌ت، الله تعالى نیه‌ت پاكیمان پێ ببه‌خشێت و بمانپارێزێت له‌ ڕیا و خۆ ده‌رخستن.

سه‌ره‌تای ده‌ست پێ كردنم به‌ وه‌رگێڕانی ئه‌م نامیلكه‌ به‌ سووده‌ش ئه‌وه‌ بوو ئیماندارێكی زۆر به‌ڕێز و خه‌مخۆری ئیسلام داوایان لێ كردم كه‌ وه‌ریگێڕمه‌ سه‌ر زمانی كوردی الله لێی ڕازی بێت، منیش زۆر به‌ په‌رۆشه‌وه‌ هه‌وڵمدا له‌ زووترین كات ئاماده‌ بێت، سه‌ره‌ڕای سه‌رقاڵیه‌كی زۆر ته‌نها له‌ پێناو اللهتعالى بۆ ئه‌وه‌ی ئێوه‌ی گه‌نجانی به‌ڕێز ڕێگای ڕاست بگرنه‌ به‌رو به‌ره‌و ڕێگای هه‌ق بڕۆین و ببێته‌ توێشوی قیامه‌تیش بۆ گشت لایه‌ك.

ئه‌م نامیلكه‌یه‌ كۆمه‌ڵه‌ وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌یه‌كی زۆر به‌سوودی سه‌له‌فی ساڵحی تێدایه‌ بۆ ئه‌وه‌ی گه‌نجان ئاگاداری ئه‌م ته‌مه‌نه‌ بن و به‌فیڕۆی نه‌ده‌ن ئاواته‌خوازم كه‌ بیخوێننه‌وه‌ و سوودی لێ وه‌ربگرن و بیر له‌ دواڕۆژی خۆتان بكه‌نه‌وه‌ .

به‌ڕاستی ئه‌وه‌ی ده‌یبینن حاڵی گه‌نجانی ئه‌مڕۆمان له‌و په‌ڕی فه‌وتان و تیاچوونه‌ ئه‌و ته‌مه‌نه‌ جوانه‌ی خۆیان به‌شتی بێ سوود و بێ كه‌ڵك به‌فیڕۆ ده‌ده‌ن و به‌ ڕێژه‌یه‌كی

زۆر زۆر دوورکەوتوونەتەوە لە فێربوونی زانست و زانیاری شەرعی و بگرە ئێستا گەنجان هەر گرنگیش بە فێربوونی زانست و زانیاری شەرعی نادەن، لە یادیان چووە کە پێویستە لەسەریان خۆیان فێری زانست و زانیاری پێویست بکەن و ئوممەتێک لە گومڕایی ڕزگاربکەن چەوساوەکانی ئوممەتی ئیسلام چاوەڕوانی ئێوەن کە بتوانن لەداهاتوودا ڕزگاریان بکەن و مایەی دڵخۆشی و سەربەرزی بن بۆ ئوممەتەکەمان، ئەی گەنجی بەڕێز ئەم تەمەنەی کە تۆ هەتە ئێستا وەک گوڵێکی گەشاوە و جوانە، جا ئەی گەنجی ژیر تا گوڵی تەمەنت سیس نەبووە هەوڵدە بۆنخۆشی و جوانیەکەت لە هەموو پارچەیەکی زەوی بڵاوبکەیتەوە و خەڵکی سوودت لێ وەربگرن و هەروەها توێشووی قیامەتیش بۆخۆت کۆبکەیتەوە هەوڵمەدە هەموو کاتەکانت خەریکی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بیت و بەدیار یاریە بێ مانا ئەلیکترۆنیەکان خەریک بیت وابزانیت ژیان هەر ئەوەندەیە سوێند بە الله کەمێک تەمەنت بەسەر بچێت و ئەرکی قورسی ژیان بکەوێتە ئەستۆت ئەوکات حەزت لێیە فێرە زانست و زانیاری بیت بەڵام کاتت نییە ئەوکات پەشیمان دەبیتەوە کە تەمەنی گەنجی و دەست بەتاڵیت بەفیڕۆدا و خەفەتێکی زۆریشی بۆ دەخۆی ئاوات دەخوازیت کە بگەڕێیتەوە تەمەنی گەنجی بۆ ئەوەی خۆت شارەزا بکەی، بەڵام تازە پەشیمانی سوودی نییە و گەڕانەوەی نییە بۆ قۆناغی گەنجی قۆناغێکی زۆر خێرایە و ئەگەر فریای خۆت نەکەویت ئەوە خێرو بەرەکەتی ئەو تەمەنەت زوو لە دەست دەچێت، بۆیە ئایا پێویست نییە لەسەر گەنجانی ئەمڕۆ کە گەنجانی پێشوی ئوممەتی ئیسلام بکەنە پێشەنگ بۆخۆیان و چاویان لێ بکەن و بڵێن ئەوان لە تەمەنی گەنجی چۆن بوون و چۆن لە پێناو الله تێکۆشان و پیاوی ئازاو



قارەمانیان تێدا بوو و بەوپەڕی خەبات و کۆڵنەدان خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانانیان کردووە.؟!

شتێکی تریش کە زۆر حەزم کرد ئاماژەی پێ بدەم چونکە ئەمڕۆ لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان گەنجانمان هەر کەسێک پۆستێکی ئایینی کرد یاخود لەم جۆرە بابەتانە بیروباوەڕی خۆیان دەگۆڕن و هەر ڕۆژە و دەیانبینم دەچنە سەر بیرو باوەڕێکی جیاواز ئەگەر من یاخود هەر کەسێکی تر پۆستێکی ئایینیمان کرد یاخود من یان هەرکەسێکی تر نامیلکەیەکمان نوسی یاخود وەریگێڕانمان بۆی کرد مانای ئەوە نییە من یاخود ئەو کەسانەی تر زاناترین کەس بین.!

بۆیە بۆ هەموو کێشەکان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت و فەتواو پەرتوکی زانایە گەورە متمانە پێکراو و بەڕێزەکانی ئوممەت.

ئاگاداربە بەهۆی نامیلکەیەک یاخود فەتوای کەسانێکی تازە شارەزا لە زانست و زانیاری شەرعی نەکەی بیرو باوەڕت بگۆڕی و تووشی لادان و گومڕایی ببیت و دونیاو قیامەتت بفەوتێنی.

لە اللە تعالی داواکارم من و ئێوەو گشت گەنجانی ئیسلام بپارێزیت و بەدوورمان بگرێت لەوەی تووشی گومڕایی و لادان بین بەهۆی کەم شارەزایی خۆمان و کەم شارەزایی کەسانی تر لە زانستی شەرعی، بۆیە پێویستە تەنها کێشەکانمان بگەڕێنینەوە بۆ لای قورئان و سوننەتی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەوەی هیچ کات ڕێگای هەقمان لێ ون نەبێت و بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ بگەینە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بەسەربەرزی و ڕێزەوە.





داواکارین لە اللە تعالی لەو بەڕێزانەش ڕازی بێت کە هاوکاریان کردم لە ئامادەکردن و بڵاو کردنەوەی ئەم نامیلکەیە، اللە تعالی پاداشتی نەبڕاوەیان پێ ببەخشێت لە ڕۆژی قیامەت و بەفردوس الاعلی شادیان بکات لەگەڵ خوێنەرە بەڕێزەکانیش.

خوشکی بچوکتان خزمەتکاری ئیسلام

دایکی خوبەیب

زاینی ٥_ ١_ ٢٠٢١

کۆچی ٢١ _٥_١٤٤٢

ڕۆژی سێ شەممە



# الوصية الأولى

# وەسیەت و ڕاسپاردەی یەکەم

**عن أبي الأحوص قال: قال أبو إسحاق وهو عمرو السبيعي: يامعشر الشباب اغتنموا أي شبابكم فلما تمر بي ليلة إلا و أقرأ فيها ألف آية، و إني لأقرأ البقرة في ركعة، و إني لأصوم أشهر الحرم، وثلاثة أيام من كل شهر، والإثنين والخميس، ثم تلا: (وأما بنعمة ربك فحدث)** سورتی الضحی ئایەتی (١١)[1]

له ابي الاحوس گووتی: ابواسحاق گوتویەتی: وە ئەو عمرو السبیعي: ئەی کۆمەڵەی گەنجان لە دەست خۆتانی مەدەن بەدەستی بهێنن، واتە گەنجیتان هەر شەوێک بەسەرمدا تێپەڕ دەبێت ئیلا هەزار ئایەتی تێدا دەخوێنم، وەمن سوڕەتی البقرة دەخوێنم لەیەک ڕکەعەتدا، وە من لە مانگە قەدەغە کراوەکان بەڕۆژوو دەبم، وە سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک، وە ڕۆژەکانی دووشەممەو پێنج شەممەش بەڕۆژوو دەبم، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (بەڵکو دەربارەی نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و باسیان بکە لە جێی خۆیاندا بەکاریان بهێنە.

**قوله: (أقرأ ألف آية في الليلة): يراد به التقريب لا التحديد، ومعناه أنه يختم القرآن في كل أسبوع مرة، وختم القرآن في كل أسبوع مرة هو دأب عامة السلف.**

وتەکەی: هەزار ئایەت دەخوێنم لە شەوێکدا مەبەستی پێی نزیک بوونەوەیە نەوەک دیاری کردن بێت، وە مانای ئەوەیە ئەو لە هەموو هەفتەیەکدا خەتمێکی قورئان دەکات ئەوە ڕێباز و نەریتی تێکڕایی پێشینە چاکەکانی سەلەفە.

[1] - أخرجه الحاكم في(المستدرك) برقم (٣٩٤٧).



**(وعن عمرو بن ميمون أنه كان يلقى الرجل من إخوانه فيقول: (لقد رزقني الله البارحة من الصلاة كذا، ورزق من الخير كذا)[1]**

واته: وه له عمرو بن میمون کاتێک به‌دیداری پیاوێک ده‌گه‌یشت له‌براکانی جا ده‌یگووت: الله تعالی دوێنی شه‌و ئه‌وه‌نده نوێژه‌ی پێم به‌خشی، وه له ڕزقی خێر و چاکه‌ش ئه‌وه‌نده‌ی پێم به‌خشی.

**قال أبو عبدالله الحاكم في (المستدرك) بعد إخراجه للأثرين السابقين: (فرحم الله عمرو بن عبيدالله السبيعي، وعمرو بن ميمون الأودي، فلقد نبها لما يرغب الشباب في العبادة).**

واته: ابو عبدالله الحاكم له (مستدرک) له دوای ده‌رهێنانی دوو ئه‌سه‌ر و سه‌رچاوه‌که‌ی پێشودا گوتوویه‌تی: ڕه‌حمه‌تی الله له عمرو بن عبیدالله السبیعي بێت، وه له عمرو بن میمون الأودي ش بێت، جا به‌دڵێنیاییه‌وه هۆشیاریان داوه له‌وه‌ی ئاره‌زووی گه‌نجان زیاد بکات بۆ الله په‌رستنی.

---

[1] - أخرجه الحاكم في(المستدرك) برقم (٣٩٤٨).



**وفي الأثرين أيضا: التربية بالقدوة، فالشاب يحتاج إلى هذا المقام حتى ينشط ويسهل عليه الإمتثال ، لكن ينبغي للمعلم أن يتنبه إلى حسن نيته وقصده، حتى لايقع في الرياء فيحبط عمله.**

واتە: وە لەو دوو ئەسەرە سەرچاوەش هەروەها: پەروەردەکردن بە پێشەنگە، چونکە گەنج پێویستی بەو پلەوپایە، هەیە تاوەکو چالاک بێت و هاوشێوەی و پابەندبوونی لەسەر ئاسان بێت، بەڵام پێویستە لەسەر مامۆستا ئاگاداری نیەت پاکی خۆی بێت نەوەک بکەوێتە ناو ڕو پامایی ڕیا و کردەوەکەی پوچەڵ بێتەوە.

# الوصية الثانية

# وەسیەت و ڕاسپاردەی دووەم

**ومن جملة وصايا السلف للشباب : ماجاء عن حماد بن زيد أنه قال: دخلنا على أنس بن سيرين رحمه الله في مرضه فقال: (اتقوا الله يامعشر الشباب، أنظروا ممن تأخذون هذه الأحاديث، فإنها من دينكم)[1]**

واتە: وە لە کۆمەڵە وەسیەت و ڕاسپاردەیەک لە وەسیەت و ڕاسپاردەکانی سەلەف بۆ گەنجان: ئەوەی هاتووە لە حماد بن زید ئەو گێڕایتیەوە گووتی:

چووینە ژوورەوە لای أنس بن سیرین (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) لە نەخۆشیەکەی ئینجا گووتی: لە اللە بترسن و تەقوای اللەتان هەبێت لە اللە بترسن ئەی کۆمەڵەی گەنجان، بڕوانن ئەو فەرموودانە لە کێ وەردەگرن، چونکە ئەوە لەئایینەکەتانە.

واتە نابێت فەرموودە لەهەموو جۆرە کەسێک وەربگرین .

[1] - أخرجه الخطيب في(الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع) برقم(١٣٩).

**وهذه الوصية عظيمة جدا، وهي: أن الشاب المقبل على طلب العلم وتحصيل الحديث، ينبغي أن يكون تحصيله له على أهل العلم الراسخين الأثبات، أهل الدراية والبصيرة، الأكابر في العلم، لا يأخذ العلم من كل أحد، وإنما يأخذ العلم عن صاحب سنة رسخت قدمه فيها.**

واته: وه ئه‌و وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌یه زۆر گه‌وره‌یه، وه ئه‌وه‌یه: ئه‌و گه‌نجه‌ی ڕووه و فێربوونی زانست و زانیاری وه‌رگرتن و کۆکردنه‌وه‌ی فه‌رمووده ده‌ڕوات، پێویسته وه‌رگرتنه‌که‌ی له‌سه‌ر ده‌ستی که‌سانی خاوه‌ن زانست و زانیاری بێت که جێگیر و چه‌سپاون ڕوو چوون له ناو زانست و زانیاری، که‌سانی خاوه‌ن کارامه‌و شاره‌زا و به‌رچاو ڕوون بن، پیاوه گه‌وره و هه‌ڵکه‌وتووه‌کانی خاوه‌ن زانست و زانیاری بن، نه‌وه‌ک زانست و زانیاری له هه‌موو که‌سێک وه‌ربگرێت، وه به‌ڵکو ده‌بێت زانست و زانیاری له‌و که‌سه وه‌ربگرێت که خاوه‌نی سوننه‌ت بێت و قاچه‌کانی تێیدا جێگر و چه‌سپاو بووبێت.

**فعن ابن شوذب رحمه الله قال: (إن من نعمة الله على الشاب إذا تنسك أن يواخي صاحب سنة، يحمله عليها).**

واته: جا له ابن شوذب (ڕه‌حمه‌تی اللهی لێبێت) گووتویه‌تی: به‌ڕاستی له به‌خششی الله له‌سه‌ر ئه‌و گه‌نج که ده‌ستی گرت به‌ئیسلام ئه‌وه با برایه‌تی له‌گه‌ڵ خاوه‌نی سوننه‌ت بكات، چونكه به‌ره‌و ڕێگای ڕاستی ده‌بات.

**وعن عمرو بن قيس الملائي رحمه الله قال: (إذا رأيت الشاب في أول ما ينشأ مع أهل السنة والجماعة فارجه، وإذا رأيته مع أهل البدع فايئس منه، فإن الشاب على أول نشوئه).**

واته: له عمرو بن قيس الملائي (ڕه‌حمه‌تی اللّٰه‌ی لێبێت) گووتویه‌تی: ئه‌گه‌ر گه‌نجت بینی له‌سه‌ره‌تای گه‌شه‌كردنی له‌گه‌ڵ خاوه‌نی سوننه و جه‌ماعه‌ت بوو ئه‌وه ئومێدت پێی هه‌بێت، وه ئه‌گه‌ر بینیت له‌گه‌ڵ خاوه‌نی بیدعه داهێنراوه‌كان بوو ئه‌وه لێی نائومێد به، چونكه ئاینی گه‌نج له‌سه‌ر سه‌ره‌تای گه‌شه‌كردنیه‌تی.

**وعن عمرو بن قيس رحمه الله قال: إن الشاب لينشأ، فإن آثر أن يجالس أهل العلم كاد أن يسلم، وإن مال إلى غيرهم كاد أن يعطب)[1] .**

واته: وه له عمرو بن قيس (ڕه‌حمه‌تی اللّٰه‌ی لێبێت) گووتویه‌تی: به‌ڕاستی گه‌نج پێ ده‌گات، جا ئه‌گه‌ر هه‌ڵیبژارد دابنیشێت له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی خاوه‌ن زانست و زانیاری ئه‌وه خه‌ریكه سه‌لامه‌ت بێت، وه ئه‌گه‌ر ڕووی به‌لای كه‌سانی تر چوو ئه‌وه خه‌ریكه به‌فیڕۆ بچێت.

بۆیه ئه‌ی گه‌نج پێویسته بزانی هاوڕێیه‌تی كێ ده‌كه‌یت چونكه ئه‌گه‌ر هاوڕێی باش و له خواترس هه‌ڵنه‌بژێری به‌ڕاستی ئه‌وه ته‌مه‌نی گه‌نجیت و دواڕۆژیشت به‌فیڕۆ ده‌چێت.

---

[1] - أخرج الآثار المتقدمة ابن بطة في(الإبانة الكبرى) (١/٢٠٤رقم : ٤٢_٤٤).

# الوصية الثالثة

# وەسیەت و ڕاسپاردەی سێیەم

**ماجاء عن مالك بن دينار رحمه الله أنه قال: (إنما الخير في الشباب)[1].**

واتە: ئەوەی کەهاتووە لە مالک بن دینار (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) ئەو گووتویەتی: خێرو چاکە هەمووی لەگەنجانە.

**هذا تنبيه عظيم من مالك بن دينار رحمه الله لأهمية هذه المرحلة، وأن الشاب إذا أحسن استغلالها حصل خيرا عظيما، وأصبح ما حصله في شبابه ركيزة وعمدة وأصلا ثابتا يبقى معه إلى مماته، نفعا لنفسه، ونفعا لأمته، ونصحا لغيره.**

واتە: وە ئەوە هۆشیارکردنەوەیەکی زۆر گەورەیە لەلایەن مالک بن دینار (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) لە گرنگیەتی ئەو قۆناغە، وە بەڕاستی گەنج ئەگەر بەگەڕ خستنەکانی چاک کرد خێر و چاکەیەکی زۆر گەورەی بەدەست هێناوە، وە ئەوەی لە گەنجیەتی بەدەستی هێناوە بووەتە پاڵپشت و کۆڵەکەو بنچینەیەکی جێگیر لەگەڵی دەمێنێتەوە تاوەکو کاتی مردنی، بە سوود گەیاندن بەخۆی، وە سوود گەیاندن بەئوممەتەکەی، وەئامۆژگاریش بۆ کەسانی تر.

[1] - أخرجه الخطيب في (الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع) برقم(٦٧٣)

**بينما إذا لم يحسن ذلك ، أضاع على نفسه خيرية هذه المرحلة وبركتها.**

واته: له‌كاتێكدا ئه‌گه‌ر ئه‌وبه‌ده‌ست هێنانه‌ی چاک نه‌کرد، ئه‌وه خێرو چاکه‌و پیت و به‌ره‌که‌تی ئه‌و قۆناغه‌ی له‌ده‌سته‌خۆیداوه.

**وعندما يجتمع للشاب: قوة الشباب، وفراغ الوقت، ووفرة المال باليد، فهذه تكون مهلكة له، كما قال القائل :**

واته: وه کاتێک له‌گه‌ڵ گه‌نج کۆ ده‌بێته‌وه، هێز و توانای گه‌نجی، وه ده‌ست به‌تاڵی، وه زۆری پاره‌و دارایی له‌ناوده‌ست، جا ئه‌وه ده‌بێته له ناوبه‌ر بۆی، وه‌ک چۆن که‌سێک گوتوویه‌تی:

**إن الشباب والفراغ والجده**

واته: به‌ڕاستی گه‌نجان و ده‌ست به‌تاڵی و هه‌بوونی سامان و دارایی زۆر و بێ پێویست بوو له خه‌ڵک.

**مفسدة للمرء أي مفسده**

واته: سه‌رچاوه‌ی خراپه و بێ ئابڕووییه ئای چ جۆره خراپه‌و بێ ئابڕووییه‌كه.



**فإذا أنضم إلى قوة الشباب ، وفراغ الوقت، ووفرة المال أمر رابع: وهو كثرة الفتن، وقربها من الشاب، وكثرة أبوابها، فهذه من أعظم المهلكات للشاب التي يجني بها على مرحلة شبابه جناية عظيمة، ويفوت على نفسه خير الشباب وبركته.**

واته: جا ئه‌گه‌ر ئه‌وشتانه هاته پاڵ هێزو توانای گه‌نج، وه ده‌ست به‌تاڵی و، وه زۆری ماڵ و سامان هۆكاری چواره‌م : وه ئه‌وه‌ش زۆری فیتنه و ئاشوبه، وه به‌هۆی نزیكیه‌كه‌ی له گه‌نج، وه زۆری ده‌رگاكانی، جائه‌وه له گه‌وره‌ترین له ناوچوونه‌كانه بۆ گه‌نج ئه‌و تاوانی كرد له به‌رامبه‌ر گه‌نجایه‌تی خۆی، وه خێرو چاكه و به‌ره‌كه‌تی گه‌نجی له ده‌سته‌خۆی ده‌دات.

فمالك بن دينار رحمه الله كان يقول: (إنما الخير في الشباب)، تنبيها منه على عظم البركة والخير في هذه المرحلة إذا وفق الله الشاب وأعانه على استغلا لها فيما يرضيه.

واته: جا مالک بن دینار (ڕه‌حمه‌تی اللّٰه‌ی لێبێت) گووتوویه‌تی: به‌ڕاستی خێرو چاكه له‌گه‌نجانه ئاگاداركردنه‌وه‌یه‌ک له‌لایه‌نی ئه‌ووه له‌سه‌ر خێرو به‌ره‌كه‌تی گه‌وره له‌و قۆناغه‌ی ئه‌گه‌ر الله سه‌ركه‌وتووی بكات و یارمه‌تی بدات له‌سه‌ر به‌هه‌لزانین و به ده‌ست هێنانی له‌وه‌ی كه الله پێی ڕازی ده‌بێت.



## الوصية الرابعة

## وەسیەت و ڕاسپاردەی چوارەم

**ومن وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماجاء عن زيد بن أبي الزرقاء قال: خرج سفيان_ يعني الثوري _ ونحن على بابه فقال: (يا معشر الشباب تعجلوا بركة هذا العلم، فإنكم لاتدرون لعلكم لا تبلغون ماتؤملون منه، ليفد بعضكم بعضا)[1].**

واته: له وەسیەت و ڕاسپاردەكانی سەلەف (ڕەحمەتی اللّەیان لێبێت) بۆ گەنجان: لەوەی كە هاتووە لە زید بن أبي الزرقاء، گووتی: سفیان هاتە دەرەوە مەبەستی الثوریە وە ئێمە لە بەر دەرگای بووین جا گووتی: ئەی كۆمەڵەی گەنجان پەلە بكەن لە بەرەكەتی ئەم زانست و زانیاریە، چونكە بەڕاستی ئێوە نازانن لەوانەیە نەگەنە ئەو شتانەی كەئاواتی پێ دەخوازن، تاوەكو هەندێكتان سوود بەهەندێكی ترتان بگەیەنن.

**قوله: (تعجلوا بركة هذا العلم) أي: انتهزوا فرصة شبابكم واغتنموها لتحصلوا العلم، لأن الإنسان إذا كبر لا يكون عنده من النشاط والذاكرة والقدرة على الإستذكار مثلماهو في مرحلة شبابه، إضافة إلى ما يكتنفه من المسؤليات وأعمال ومشاغل ومصالح، بينما الشاب ليس عنده شيء من ذلك، و أيضا فإن مرحلة الشباب تنقضي سريعا.**

---

[1] - أخرجه أبو النعيم في كتابه (حلية الأولياء) (٦/٣٧٠).



واتە: وتەکەی کە گووتی: (پەلە بکەن لەبەرەکەتی ئەم زانست و زانیاریە) واتە: بەکاری بهێنن ئەو هەلە بقۆزنەوە گەنجیتان لە دەست خۆتان مەدەن تاوەکو زانست و زانیاری بەدەست بهێنن، چونکە مرۆڤ کە تەمەنی گەورەبوو ئەوە وەکو پێویست چالاکی و بیرەوەری و توانای نامێنێت بیرهاتنەوەی لاواز دەبێت وەک ئەوە نییە کە ئەو لە قۆناغی گەنجی هەیبووە، وە ئەرکی زۆریشی دێتە پاڵ و دەکەوێتە ئەستۆی وەک بەرپرسیاریەتی و کارو بارو سەرقاڵی زۆر و بەرژەوەندیەکان، لە کاتێکدا گەنج هیچی نییە لەم سەرقاڵیانە، وە هەروەها قۆناغی گەنجی زۆر بە پەلە بەسەر دەچێت.

**كما قال الإمام أحمد رحمه الله (ما شبهت الشباب إلى بشيء كان في كمي فسقط)[1].**

واتە: وەک إمام أحمد (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) گوتوویەتی: گەنجم بەهیچ شتێک نەچواندووە جگە لە شتێک کە لەناو قۆڵی کراسەکەم هەڵمگرت بێت و دواتر کەوتبێتە خوارەوە. مەبەستی لەوەیە تەمەنی گەنجی زۆر بەخێرایی تەواو دەبێت.

**قوله: (فإنكم لاتدرون لعلكم لاتبلغون ما تؤملون منه) أي: أن الشاب قد يؤمل أن يحصل من العلم كذا، وأن يحفظ كذا، وأن يقرأ من الكتب كذا، وغيرها من الأمور التي يؤملها، فلا يحصل، ولكن إذا جاهد نفسه، واستعان بالله، وحرص على اغتنام مرحلة شبابه، فإنه بإذن الله عزوجل يحصل خيرا عظيما.**

---

[1] - ذكره الحافظ الذهبي في (سير الأعلام النبلاء) (١١/٣٠٥)

واتە: وە وتەکەی: (جا بێ گومان ئێوە نازانن لەوانەیە نەگەنە ئەوشتانەی کە ئاواتی بۆ دەخوازن) واتە بەڕاستی گەنج ڕەنگە ئاوات بخوازێت ئەوەندە زانست و زانیاریە بەدەست بهێنێت، وە ئەوەندەش لەبەر بکات، وە ئەوەندە پەرتوکەش بخوێنێتەوە، وە جگە لەوانەش زۆر کار و داخوازی تر کە ئاواتی بۆ دەخوازێت، جا بەدەستی ناهێنێت، بەڵام ئەگەر بەخودی خۆی تێکۆشا، وە داوای یارمەتی لە الله کرد، وە سوڕ بوو لە بەدەست هێنانی قۆناغی گەنجیەتی، جا بەڕاستی ئەوە بەویستی الله خێرو چاکەیەکی زۆری دەست دەکەوێت.

**والله عزوجل يقول: (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ)[1]**

الله تعالی دەفەرمووێت: ئەوانەش لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە؛ هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بە الله بەڕاستی ئەوانە ڕێنموونی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاک و دروستی خۆمان کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە بێگومان اللەی پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە.

**وقوله: (ليفد بعضكم بعضا): فيه حث للشباب على اغتنام لقاءاتهم ببعض بالفائدة النافعة، وحسن تذاكر العلم .**

واتە: وە وتەکەشی: (تاوەکو هەندێکتان سود بەهەندێکی ترتان بگەیەنن ) هاندانی تێدایە بۆ گەنجان لەسەر بەهەلزانین و بەدەست هێنانی چاوپێکەوتنەکانیان لەگەڵ یەکتر بەهەندێک سود وقازانج وەرگرتن، وە باشی پێداچوونەوەی زانست.

[1] - سورەتی العنكبوت ئایەتی: ( ٦٩)



## الوصية الخامسة

## وەسیەت و ڕاسپاردەی پێنجەم

**ومن وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماورد عن الحسن البصري رحمه الله كثيرا ماكان يقول: (يا معشر الشباب، عليكم بالآخرة فاطلبوها،فكثيرا رأينا من طلب الآخرة فأدركها مع الدنيا، وما رأينا أحدا طلب الدنيا فأدرك الآخرة مع الدنيا)[١].**

واتە: وە لە وەسیەت و ڕاسپاردەکانی سەلەف (ڕەحمەتی اللەیان لێبێت) بۆ گەنجان: ئەوەی هاتووە لە حسن البصري (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) زۆر دەیگووت: ئەی کۆمەڵەی گەنجان، وریای دوارۆژ بن جا داوای بکەن، چونکە زۆر کەسمان بینی ئەوانەی داوای دوا ڕۆژیان دەکردو پێویستیەکانی دونیاشیان لەگەڵ بەدەست هێنا، وەهیچ کەسێکمان نەبینی داوای دونیا بکات پێویستیەکانی دوارۆژیش بەدەست بهێنێت لەگەڵ دونیا.

**وهذا تنبيه عظيم جدا من الإمام حسن البصري رحمه الله للشباب بأن يجعل همه الآخرة، وأن يعتني بتحصيلها، وشغل وقته بما يقربه من ربه، فإن فعل ذلك فإن الله عزوجل يمن عليه بنصيبه وحظه من الدنيا.**

واتە: جا ئەوە ئاگادار کردنەوەیەکی گەورەیە لە لایەن ئیمام حسن البصري (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) بۆگەنج تاوەکو وابکات هەموو خەمی تەنها بۆ دوارۆژ بێت،

---

[١] - أخرجه البيهقي في(كتاب الزهد) (١٢)

وه هه‌روه‌ها گرنگی بدات له به‌ده‌ستهێنانی.
خۆی به‌وشتانه سه‌رقاڵ بكات كه له په‌روه‌ردگاری نزیكی ده‌كاته‌وه، جا ئه‌گه‌ر وای كرد ئه‌وه الله تعالى به‌سه‌ریدا ده‌بارێنێت به به‌شی خۆی خۆشی و كامه‌رانی له‌دونیا.

**ولا يفهم مما تقدم أن الإنسان يترك تحصيل مايقيم دنياه، ورزقه ومسكنه و ملبسه، ويبقى عالة على الآخرين، بل لا يضر المسلم أن يعمل ويكدح ويحصل المال _ ولو أصبح المال عنده كثيرا_ لكن الذي يضره أن تكون الدنيا همه وبغيته ومقصده ومبلغ علمه.**

واته: ئه‌وه ئاوا تێنه گه‌یه‌ندرێت ئه‌وه‌ی پێشتر باسكرا كه‌وا مرۆڤ واز له به ده‌ستهێنانی ئه‌وه بێنێت كه دونیای پێ بنیاد ده‌نێت له ڕزق و ڕۆزی و جێگای نیشته‌جێ بوون وجل و پۆشاكی، وه نه‌وه‌ک دواتر ببێته بار به‌سه‌ر كه‌سانی تره‌وه، به‌ڵكو كاركردن و كۆڵنه‌دان و ده‌سكه‌وتنی ماڵ و سامان زیان به موسوڵمان ناگه‌یه‌نێت _هه‌تا ئه‌گه‌ر پاره و سامانیشی زۆر ببێت_ به‌ڵام ئه‌وه‌ی زیانی پێ ده‌گه‌یه‌نێت ئه‌وه‌یه كه دونیا ببێته خه‌م و ویست و مه‌به‌ست و گه‌یشتن به‌زانست و زانیاری بۆی.



**كما جاء عن النبي ﴿ﷺ﴾ أنه كان يقول في دعائه: (ولا تجعل الدنيا أكبر همنا ولا مبلغ علمنا)[1].**

وەک چۆن هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ ئەو لەپاڕانەوەکانی دەیفەرموو: دونیا نەکەیتە گەورەترین خەممان وە نەیکەیتە ئەوەی تەنها زانست و زانیاریمان بۆ دونیابێت.

**وقال ﴿ﷺ﴾ أيضا: (إنك إن تذر ورثتك أغنياء، خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس)[2].**

واتە: وە هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ئەگەر تۆ میرات گرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت، خێر و چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت و ببنە ئەرک و بار بە سەرشانی خەڵکی.

**فمن جعل همه الآخرة ، جمع الله عليه شمله، و أتته الدنيا وهي راغمة، لكن من جعل همه الدنيا، جعل الله فقره بين عينيه، ولم يأته من الدنيا إلا ماكتبه الله عزوجل له .**

جا هەرکەسێک دوا ڕۆژی کردە گەورەترین خەمی، ئەوە الله تعالى پەرتەوازەکانی بۆ کۆکردەوە، وە دونیاشی بەدەست هێنا بەڵام ئەو پشتی تێ کرد، بەڵام هەر کەسێک دونیا بکاتە گەورەترین خەمی، الله هەژاریەکەی دەخاتە نێوان چاوەکانی، وە هیچی تری بۆ نایەت لە دونیا جگە لەوەی الله تعالى بۆی نوسیوە.

---

[1] - أخرجه الترمذي في(الجامع) الأبواب: الدعوات ، رقم (٣٥٠٢) وحسنه الألباني في (الكلم الطيب) رقم (٢٢٦).

[2]- أخرجه البخاري في(صحيحه) رقم (١٢٩٥) ، ومسلم في (صحيحه) رقم (١٦٢٨).




# الوصية السادسة

# وەسیەت و ڕاسپاردەی شەشەم

**من وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماجاء عن عقبة بن أبي حكيم قال: كنا نجلس إلى عون بن عبدالله فيقول لنا: (يامعشر الشباب، قد رأينا الشباب يموتون، فما ينتظر بالحصاد إذا بلغ المنجل ) ويمس لحيته.[1]**

له وەسیەت و ڕاسپاردەکانی سەلەف (ڕەحمەتی اللهیان لێبێت) بۆ گەنجان: ئەوەی هاتووە لە عقبة بن ابي حكيم گوتوویەتی: کاتێک ئێمە دادەنیشتین لە لای عون بن عبدالله جا بەئێمەی دەگووت: (کۆمەڵەی گەنجان، بەدڵنیاییەوە گەنجان دەبینین دەمرن، جا چاوەڕێی چی لە بەرووبووم دەکرێت کاتێک گەیشتە داس ئامێرێکی دەستە بۆ دروێنە کردن بەکاردەهێنرێت) وە دەستی لە ڕیشی دەدا مەبەستی گەورەبوون و بەساڵاچوونی تەمەن بوو.

**مراده رحمه الله أن من بلغ هذا السن حان له أن يحصد، لأن الزرع إذا تم حان حصاده،و الذي كبر أيضا دنت منيته، فذكر لهم ذلك ينبههم ألا يغتر الإنسان برؤيته لمن أمد له في العمر، لأن كثيرا من الناس يغتر عندما يرى بعض المعمرين، ويظن أنه سيبلغ من العمر مثله، فيفرط في كثير من الأمور ويسوف ويؤجل، كما قيل:**

---

[1] - أخرجه ابن أبي الدنيافي كتابه (العمروالشيب) برقم (٤٢)

مەبەستی پێی ئەوەیە (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) ئەوا هەر کەسێک گەیشتە ئەو تەمەنە کاتی ئەوەی هاتووە کە دروێنە بکرێت، چونکە کشتوکاڵ کە پێ گەیشت کاتی دروێنەیەتی، وە ئەوەش کە گەورە بوو مردنی نزیک بۆتەوە، جا ئەوەی بۆ یادەوەری کردن باسکردن تا ئاگاداریان بکاتەوە کە مرۆڤ فریو نەخوات بە بینینی ئەو کەسانەی کە تەمەنیان درێژ بووە بەساڵاچوون، چونکە زۆر لە خەڵکی فریو دەخوات کاتێک کەسانی بەتەمەن و بەساڵاچوو دەبینێت، وا گومان دەبات کە ئەویش تەمەنی دەگاتە ئەوتەمەنەی ئەوان، جا زیادەڕەوی لە زۆر کارو داخوازیەکان دەکات وە هەردەڵێت لەمەودوا ئەوشتە دەکەم وە هەر دوای دەخات وەک چۆن وتراوە.

**يعمر واحد فيغر قوما**

کەسێک تەمەنی درێژ دەبێت بەساڵا دەچێت گەل و هۆزێک فریوی پێ دەخۆن

**وينسى من يموت من الشباب**

وە لەیاد دەکرێت لەوانەی کە دەمرن لە گەنجان

**وفي المعنى نفسه جاء عن الحسن البصري أنه قال ذات يوم لجلسائه_ وكان فيهم شيوخ وشباب: (يا معشر الشيوخ ما ينتظر بالزرع إذا حصد؟ قالوا: الحصاد، قال: يامعشر الشباب: إن الزرع قد تدركه العاهة قبل أن يبلغ )[1].**

واتە: وەک هەمان مانای خۆی هاتووە لە حسن البصري وە ڕۆژێک لەگەڵ ئەو کەسانەی بەیەکەوە دانیشتبوون گەنج و پیاوی بەتەمەن ڕیش سپیشی تێدابوو

[1] - أخرجه البيهقي في(كتاب الزهد) برقم(٥٠٠).



(ئەی کۆمەڵەی پیاوە ڕیش سپیەکان چی چاوەڕوانی کشتوکاڵ دەکات کە بەرووبومی پێ گەیشت.؟
گووتیان: دروێنە دەکرێت، گوتی ئەی کۆمەڵەی گەنجان لەوانەیە کشتوکاڵ تەفروتونا بێت لەناوچێت پێش ئەوەی پێ بگات.

**فينبغي للمسلم أن يكون حاله كما جاء في الأثر: (إذا أمسيت فلا تنتظر الصباح، وإذا أصبحت فلا تنتظر المساء)[1].**
واتە: جا پێویستە لەسەر موسوڵمان کە بارودۆخی وابێت وەک چۆن هاتووە لە أثر سەرچاوە (ئەگەر ئێوارەت بەسەرداهات ئەوە چاوەڕوانی بەیانی مەکە، وە ئەگەر بەیانیت بەسەر داهات چاوەڕوانی ئێوارە مەکە).
واتە چاوەڕوانی ئەوە مەکە کە ئاخۆ بەیانی داهات دەژی یان نا چونکە ڕەنگە شەو بچیتە خەو ئیتر مردن یەخەت پێ بگرێت و لەخەو خەبەرت نەبێتەوە یان بەیانیت بەسەردا داهات ڕەنگە نەگەیتە شەو مردن
یەخەت پێ بگرێت پێویستە هەمیشە ئامادەبی بۆ مردن چونکە کات وساتی نادیارە.

**قال ابن الجوزي رحمه الله: (يجب على من لايدري متى يبغته الموت أن يكون مستعدا، ولا يغتر بالشباب والصحة، فإن أقل من يموت الأشياخ، وأكثر من يموت الشبان، ولهذا يندر من يكبر)[2] .**

---

[1] - أخرجه البخاري (٦٤١٦) عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما موقوفا عليه.
[2]- (صيد الخاطر) ص (٢٤٠)



واته: ئیبن جوزي (ڕه‌حمه‌تی اللّٰه‌ی لێبێت) گوتوویه‌تی: پێویسته له‌سه‌ر ئه‌و که‌سه‌ی که نازانێت که‌ی مردن یه‌خه‌ی پێ ده‌گرێت ئه‌وه با هه‌میشه ئاماده‌بێت و فریو نه‌خوات به گه‌نجی و له‌ش ساغی، که‌مترین که‌س له‌وانه‌ی که ده‌مرن پیاوه به‌ته‌مه‌نه‌کانن، وه زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی که ده‌مرن گه‌نجه‌کانن، جا بۆیه ده‌گمه‌نه ئه‌وه‌ی ته‌مه‌نی درێژ بێت و به‌سالاَّبچێت.

**وشاهد ذلك أنك إذا نظرت في الأسر فستجد المعمرين قلة، وأكثر من يموت يكون في مرحلة الشباب أو الطفولة.**

واته: وه ئه‌وه سه‌یر بکه ئه‌گه‌ر تۆ بڕوانیه خێزان و بنه‌ماڵه‌کان ده‌بینی به‌ته‌مه‌ن و به‌سالاَّچوویان که‌مه، وه زۆرترین که‌س له‌وانه‌ی که ده‌مرن له قۆناغی گه‌نجیه یان منداڵیه.

# الوصية السابعة

# وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌ی حه‌وته‌م

**ومن وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماجاء قابوس بن أبي ظبيان قال: (صلينا يوما خلف أبي ظبيان صلاة الأولى ،ونحن الشباب كلنا من الحي إلا المؤذن فإنه شيخ ، فلما سلم التفت إلينا، وجعل يسأل الشباب: من أنت ؟ من أنت ؟ فلما سألهم، قال_ على وجه الحث والتشجيع والتنشيط لهم _: إنه لم يبعث نبي إلا وهو شاب، ولم يؤت العلم خير منه وهو شاب )[١].**

له وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌كانی سه‌له‌ف (ڕه‌حمه‌تی اللّه‌یان لێبێت) بۆ گه‌نجان: ئه‌وه‌ی هاتووه له قابوس بن أبي ظبيان گوتوویه‌تی: ڕۆژێكیان نوێژمان كرد له پشت أبي ظبيان نوێژی یه‌كه‌م واته نوێژی به‌یانی، وه ئێمه‌ی گه‌نجان هه‌موومان خه‌ڵكی گه‌ڕه‌ك بووین ته‌نها بانگبێژه‌كه ئه‌و پیاوی به‌ته‌مه‌ن به‌ساڵاچوو بوو، جا كاتێك سه‌لامی دایه‌وه ئاوڕی له ئێمه دایه‌وه، پاشان ده‌ستی كرد به پرسیار كردن له گه‌نجان: تۆكێی؟ تۆكێی؟ جا كه پرسیاری لێ كردن، دواتر له ڕووی هاندان و غیره‌ت خستنه‌به‌رو وچالاككردن، گووتی: هیچ پێغه‌مبه‌رێك نه‌نێردراوه ئیلا گه‌نج بووه، وه خیرو چاكه‌ی وه له‌و زانست و زانیاری له‌وه خێرتر نه‌هاتووه چاكتر له‌وه‌ی كه ئه‌و له ته‌مه‌نی گه‌نجیه.

---

[١] - أخرجه خيثمة في(كتاب العلم ) برقم (٨٠).

**فنبهم على اغتنام خيرية الشباب وبركته، وأنه الفرصة العظيمة للتزود والتحصيل ، وإستغلال النشاط والقوة.**

واته: جا ئاگاداری کردنه‌وه له‌سه‌ر ئه‌م به‌هه‌لزانین و به‌ده‌ست هێنانی خێرو به‌ره‌که‌تی گه‌نجی، وه به‌ڕاستی ئه‌وه هه‌لێکی زۆر گه‌وره‌یه بۆ توێشو زیاد کردن و به‌ده‌ست هێنان، وه به‌هه‌لزانینی له چالاکی و هێز وتوانا.



## الوصية الثامنة

## وەسیەت و ڕاسپاردەی هەشتەم

**مارواه الإمام أحمد في كتابه (الورع) عن عبد الوهاب الثقفي قال: خرج علينا أيوب _أي: السختياني _ رحمه الله فقال: (يا معشر الشباب، احترفوا، لا تحتاجون أن تأتوا أبواب هؤلاء) وذكر من يكره.[1]**

ئەوەی لە إمام أحمد ڕیوایەت کراوە لەپەرتوکەکەی (الورع) لە عبد الوهاب الثقفي یەوە گووتی: _ئەیوب هاتە دەرەوە بۆ لامان واتە: السختياني (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) جاگووتی: (ئەی کۆمەڵەی گەنجان، شارەزابن خۆتان فێری پیشە و کار بکەن، تاپێویستتان نەبێت بچنە بەردەرگای ئەوانە) وە باسی ئەوانەی کرد کە ڕقی لێ بوون.

**أي أن يكون للشباب مع تحصيله للعلم حرفة يكتسب بها مالا ورزقا ينفق به على نفسه، وفيما بعد على أهله وولده، و ألا يكون عالة على الآخرين، حتى لا يحتاج إذا كبر أن يذهب إلى فلان أو إلى فلان للطلب المعاونة و المساعدة، و أبرك الرزق و أنفعه و أطيبه ماكان من كسب اليد.**

واتە: مەبەست ئەوەیە گەنج لەگەڵ بەدەست هێنانی زانست و زانیاری پێویستە شارەزایی لە پیشەیەک هەبێت کە پارەو ڕزق و ڕۆزی پێ پەیدا بکات تاوەکو لە خۆی خەرج بکات، وە دواتریش لە خێزان و منداڵەکەی خەرج بکات، تاوەکو نەبێتە بار گرانی بەسەر کەسانی ترەوە، تاوەکو کە گەورە بوو پێویستی بەوە نەبێت بچێتە لای فلاّن یان فلاّن بۆ داواکردنی هاوکاری و یارمەتی، وە پڕ بەرەکەترین ڕزق و ڕۆزی وە بەسودترینیان و خۆشترینیان ئەوەیە کە بەدەستی خۆت پەیداتت کردبێت.

---

[1] - كتاب (الورع) رقم(٩٤)

# الوصية التاسعة

# وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌ی نۆیه‌م

**ومن جملة وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماجاء عن جعفر قال: كان ثابت بن البناني رحمه الله يخرج إلينا وقد جلسنا في القبلة فيقول: (يا معشر الشباب، حلتم بيني و بين ربي أن أسجد له ) وكان قد حببت إليه الصلاة.[1]**

واته: وه له كۆمه‌ڵه وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌كانی سه‌له‌ف (ڕحمه‌تی الله‌یان لێبێت) بۆ گه‌نجان: ئه‌وه‌ی هاتووه له جعفر گووتی : ثابت البناني (ڕه‌حمه‌تی الله‌ی لێبێت) ئه‌وا به‌سه‌رماندا ده‌هات وه ئێمه دانیشتبووین ڕوو له ڕووگه جا ده‌یگوت: (ئه‌ی كۆمه‌ڵه‌ی گه‌نجان، ئێوه ڕێگربوون په‌رده‌تان خسته نێوان من و په‌روه‌ردگارم كه كڕنووشی بۆ ببه‌م ) وه ئه‌و نوێژی زۆر له‌لا خۆشه‌ویست بوو.

**يشير رحمه الله إلى أن بعض الشباب الذين يلتقون ويجتمعون في المسجد، ويستغلون فرصة لقائهم بأصدقائهم في المسجد بالأحاديث الجانبية، ويكون إلى جوارهم من جاء المسجد ليعبدالله، و يطمئن في صلاته و يخشع، فيحولون بينه وبين صلاته، فلا هم اشتغلوا في المسجد بالعبادة والذكر لله عزوجل، ولاهم تركوا من جاء ليعبد الله في المسجد أن يشتغل بالعبادة ويقبل عليها.**

واته: ئاماژه به‌وه ده‌كات (ڕه‌حمه‌تی الله‌ی لێبێت) كه هه‌ندێک له‌گه‌نجان كه به‌یداری یه‌كتر شاد ده‌بن و كۆده‌بنه‌وه له‌مزگه‌وت، ئه‌و هه‌له ده‌قۆزنه‌وه له

---

[1] - رواه أبو نعيم في (حلية الأولياء) (٢/٣٢٢)

دیداره‌کانیان له‌گه‌ڵ هاوڕێکانیان به‌قسه‌و گفتوگۆی ئه‌ولا ولا و بێ سوود، وه له تەنیشتیشیان خه‌ڵکێکی لێیه هاتووه تا الله بپه‌رستێ، وه له نوێژه‌کانی هه‌ست به ئارامی بکات و ملکه‌چ بێت، وه ده‌که‌ونه نێوان ئه‌و نێوان نوێژه‌که‌ی، نه ئه‌وان له مزگه‌وت سه‌رقاڵبوون به زیکر و یادی الله تعالی وه نه‌هێشتیان ئه‌و که‌سانه‌ی هاتوون بۆ الله په‌رستن سه‌رقاڵی بکه‌ن به عیباده‌ت و په‌رستن وه تاوه‌کو ڕوو له الله په‌رستی بکات.

**ولهذا، فمما يحتاج أن يتنبه له الشاب مراعاة حرمة ومكانة أهل المسجد، لئلا يشغلهم بأمورجانبية عن العبادة والطمأنينة و الخشوع في الصلاة .**

واته: وه جا بۆیه، ئه‌وه‌ی که پێویسته گه‌نج ئاگاداری ڕه‌چاوکردنی ڕێزو پله و پایه‌ی مزگه‌وت بێت، وه ڕه‌چاوکردنی ڕێز و پله‌و پایه‌ی خه‌ڵکی مزگه‌وت بێت، تاوه‌کو به‌شتی بێ که‌ڵک و ئه‌ولاو لا سه‌رقاڵیان نه‌که‌ن له جیاتی الله په‌رستن ودڵنیایی، وه ملکه‌چی له‌نوێژکردن.

**ناهيك عما استجد في هذا الزمان من وسائل الإتصال التي يحملها الشاب في جيبه، فربما أشغل الناس في صلاتهم برنين هاتفه أو برده على الهاتف أو نحو ذلك، مما يحدث للناس تشويشا في صلاتهم ، وعدم الراحة والطمأنينة.**

واته: لێت قه‌ده‌غه ده‌کات له‌وه‌ی که له‌م سه‌رده‌مه به‌ر ده‌سته له ئامێره‌کانی په‌یوه‌ندی کردن ئه‌وه‌ی گه‌نج له گیرفانی هه‌ڵی ده‌گرێت، جا له‌وانه‌یه به‌هۆی زه‌نگی مۆبایله‌که‌ی خه‌ڵکی سه‌رقاڵ بکات له نوێژه‌که‌یان یان به وه‌ڵامدانه‌وه‌ی په‌یوه‌ندیه‌کان له‌م جۆره شتانه، له‌وه‌ی که ژاوه ژاو دروست ده‌کات بۆ خه‌ڵکی له نوێژه‌کانیان، وه نه‌مانی ئیسراحه‌ت و هێمنی و ئارامی.



## الوصية العاشرة

## وەسیەت و ڕاسپاردەی دەیەم

**ومن جملة وصايا السلف رحمهم الله للشباب: ماجاء عن محمد بن سوقة قال: (لقيني ميمون بن همران فقلت: حياك الله، فقال: هذه تحية الشباب، قل بالسلام) أي: سلم.[1]**

واته: وه له كۆمه‌ڵه وه‌سیه‌ت و ڕاسپارده‌كانی سه‌له‌ف (ڕه‌حمه‌تی الله‌یان لێبێت) بۆ گه‌نجان: ئه‌وه‌ی هاتووه له محمد بن سوقه گووتی: (له میمون بن همران پێم گه‌یشت جا گووتم: الله بتژێنێ یاخود له‌ناو خۆمان ده‌ڵێین ئه‌م كاته‌ت باش: جا گووتی: ئه‌وه سڵاوی گه‌نجانه‌یه ، بڵێ به‌سه‌لام ) واته سه‌لام بكه .

**وفي الحديث عن النبي ﷺ: (من بدأ بالكلام قبل السلام فلا تجيبوه)[2].**

واته: وه له فه‌رمووده‌یه‌ک له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ هاتووه: هه‌ر که‌سێک ده‌ستی کرد به قسه‌کردن پێش سه‌لام کردن وه‌ڵامی مه‌ده‌نه‌وه.

---

[1] - أخرجه أبو نعيم في (الحلية) (٤/٨٦).

[2]- أخرجه ابن السني في (عمل اليوم والليلة)برقم (٢١٤) و انظر (الصحيحة) (٨١٦) .



**وقوله رحمه الله: (تحية الشباب)، أي أن بعض الشباب تستطيب نفوسهم نوعا من التحية، ويرى أنها أجمل مايكون عندما يلقى إخوانه أوزملاءه، فيترك السلام ويهجره، ويبدأ ببعض التحيات التي رغب فيها ومال إليها، فربما أقتصر عليها وترك السلام، وربما أتى بالسلام بعدها.**

واته: وه له‌وته‌كه‌ی: ڕه‌حمه‌تی اللّٰه‌ی لێبێت (ئه‌وه سڵاوی گه‌نجانه‌یه) ئه‌وه هه‌ندێک له گه‌نجان دڵیان پێ خۆش ده‌بێت به‌جۆرێک له سڵاوكردن، وا ده‌بینێت كه جوانتر به ده‌رده‌كه‌وێت كاتێک هاوڕێكان و هاوكاره‌كانی ده‌بینێت، جا ده‌ست به‌رداری سه‌لام كردن ده‌بێت و وازی لێ ده‌هێنێت، وه ده‌ست ده‌كات به هه‌ندێک سڵاوكردن له‌وه‌ی كه حه‌زی لێیه‌تی و دڵی به‌لایدا چووه خۆشه‌ویست بووه لای، له وانه‌یه بۆ كورت كردنه‌وه‌ی بێت بۆیه ده‌ست به‌رداری سه‌لام كردن بووه، وه یان له وانه‌یه دواتر سه‌لام بكات..





# الوصية الحادية العشرة

# وەسیەت و ڕاسپاردەی یانزەم

**ومن جملة وصايا السلف (رحمهم الله) للشباب أيضا ما جاء عن أبي المليح قال: قال لنا ميمون بن مهران ونحن حوله : ( يا معشر الشباب، قوتكم اجمعوها في شبابكم، ونشاطكم في طاعة الله، يا معشر الشيوخ: حتى متى ؟)[1] .**

واتە: وە لە كۆمەڵە وەسیەت و ڕاسپاردەكانی سەلەف (ڕەحمەتی اللهیان لێبێت) بۆ گەنجان: دیسان ئەوەی هاتووە لە أبي المليح گووتی: ئێمە لەچواردەوری میمون بن همران بووین پێی گووتین: (ئەی كۆمەڵەی گەنجان، هێز و تواناتان وا لێ بكەن لە گەنجی بێت بەكاری بهێنن، وە چالاكبوونیشتان بە گوێڕایەڵی كردنی الله بێت، ئەی كۆمەڵەی پیاوە ڕیش سپیەكان بەتەمەنەكان، تاوەكو كەی.؟

[1] - أخرجه أبو النعيم في (الحلية) (٤/٨٧).



**أوصى رحمه الله باستغلال قوة الشباب ونشاطه في طاعة الله (عزوجل) وما يقرب إليه.**

واتە: (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) وەسیەتی كردووە ڕایسپاردووە بە هەلزانینی هێز و توانای گەنجی و چالاكبوونی لە گوێڕایەڵی كردنی الله (عزوجل) وە ئەوشتانەش كە لەویان نزیك دەكاتەوە.

**ثم قال (يا معشر الشيوخ ; حتى متى ؟)، يعني: حتى متى تنتظرون ولاتستغلون حياتكم في طاعة الله (عزوجل)؟**

واتە: پاشان گووتی: ئەی كۆمەڵەی پیاوە ڕیش سپی بەتەمەنەكان: تاوەكو كەی؟، واتە: تاوەكو كەی چاوەڕوان دەكەن و ژیانتان بەهەل وەرناگرن لە گوێڕایەڵی كردنی الله (عزوجل)؟

## الوصية الثانية عشرة

## وەسەیەت و ڕاسپاردەی دوانزەم

**عن الفريابي قال: (كان سفيان الثوري رحمه الله يصلي ثم يلتفت إلى الشباب فيقول : إذا لم تصلوا اليوم فمتى ؟)[1].**

واته: لەوه الفريابي گوتوویەتی: سفيان الثوري (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) ئاوابوو نوێژی دەکرد پاشان ئاوڕی لە گەنجان دەدایەوە جا دەیگووت: ئەگەر ئەمڕۆ نوێژ نەکەن ئەی کەی نوێژدەکەن؟.

**أوصى سفيان الثوري (رحمه الله) الشباب وصية عظيمة باستغلال شبابهم في طاعة الله، فالشباب إذا لم يستغل مرحلة شباب في السجود لله (عزوجل) فقد يضعف ويدخل في مرحلة من حياته يود فيها أن يسجد ولكن لا يستطيع بسبب ضعف قواه، ومرض بدنه، لا يتمكن من السجود، ولهذا قال: (إذا لم تصلوا اليوم فمتى؟).**

واته: سفيان الثوري (ڕەحمەتی اللهی لێبێت) وەسیەتی کردووە بۆ گەنجان بە وەسیەت و ڕاسپاردنێکی زۆر گەورە لە بەهەلزانینی گەنجیەتیان بە گوێڕایەڵی کردنی الله، جا ئەگەر گەنج قۆناغی گەنجیەتی خۆی بەهەل نەزانێت بە کڕنووش بردنی بۆ الله جا لەوانەیە بگاتە ناو قۆناغێک لە ژیانیدا کە بێ هێزو لاواز ببێت ئارەزووی ئەوە بکات کە کڕنوشێک ببات بەڵام ناتوانێت. بە هۆی لاوازی ناساغی و نەخۆشی لاشەی توانای کڕنووش بردنی نابێت ئەمڕۆ نوێژ نەکەن کەی دەیکەن.؟

---

[1] - أخرجه أبو النعيم في (الحلية) (٧/٥٩).

# الوصية الثالثة عشر

# وەسیەت و ڕاسپاردەی سیانزەم

**ما جاء عن ربيعة بن كلثوم أنه قال: نظر إلينا الحسن ونحن حوله شباب فقال: (يا معشر الشباب، أما تشتاقون إلى الحور العين؟)[١]**

واتە: ئەوەی هاتووە لە ربيعة بن كلثوم ئەو گووتی: حسن ڕوانیە ئێمە وە ئێمە لە چواردەوری بووین جا گووتی: (ئەی کۆمەڵەی گەنجان، ئایا تامەزرۆ و شەیدای حۆری چاو گەشەکان نابن ).

**هذا التفات بديع من الإمام الحسن البصري (رحمه الله) يذكر فيه الشباب بنعيم الجنة، وما فيها من ملذات و مسرات، والتي منها الحور العين الحسان، ليتجدد بذلك النشاط و الشوق إلى الجنة ونعيمها، وإذا قام هذا في قلب الشاب دفعه ـ بعد توفيق الله تعالى ـ إلى الاجتهاد في أعمال الآخرة والسعى لها.**

واتە: ئەوە ئاوڕ دانەوەیەکی ناوازەیە لە ئیمام حسن البصري (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) یادەوەری گەنجان دەدات لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت، وە ئەوەی تیایەتی لە تام و چێژەکان و خۆشی و شادیەکان، وە لەوانەشی لەوێ هەیە حۆری ڕەوشت بەرزو شۆخ و شەنگ، تاوەکو بەوە چالاکبوون و تامەزرۆیی و شەیداییان بۆ بەهەشت و ناز و نیعمەتەکانی نوێ ببێتەوە، وە ئەگەر ئەوە لە دڵی گەنجدا دامەزرا جێگیر بوو ئەوە پاڵی دەنێت ـ لەدوای سەرکەوتنی اللە تعالی ـ بۆ کۆشش کردن بۆ کارو کردەوە چاکەکانی دواڕۆژ و هەوڵدان بۆی.

---

[١] - أخرجه ابن أبي الدنيا في كتابه في (صفة الجنة) رقم (٣١٢).



الله تعالى يقول:

**( وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا )**[1]

وه الله تعالى ده‌فه‌رمووێت: ئه‌وه‌ش مه‌به‌ستی به‌شی ئه‌و جیهان بێت و هه‌وڵ و کۆششی چاکی بۆ بدات، له هه‌مان کاتیشدا ئیماندار بێت، هه‌وڵ و کۆششی ئه‌و جۆره که‌سانه جێگه‌ی ڕێزو سوپاسه و سوپاسکراون.

---

[1]- سوره‌تی الإسراء ئایه‌تی (١٩ ) .

# الوصية الرابعة عشر

# وەسیەت و ڕاسپاردەی چواردەم

**ما جاء عن الحسن البصري أيضا (رحمه الله) أنه قال: (يا معشر الشباب، إياكم والتسويف، سوف أفعل، سوف أفعل)[1].**

واته: وە هەروەها ئەوەی هاتووە لە حسن البصري (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) ئەو گووتوویەتی: ئەی کۆمەڵەی گەنجان، هۆشیاربن نەکەن بڵێن لەمەو دوا، لەمەو دوا وا دەکەم، لەمەو دوا وا دەکەم.

**قوله: (إياكم والتسويف): التسويف هو الآفة التي أهلكت كثيرا من الشباب، كقول بعضهم: (سوف أتوب، وسوف أحافظ على الصلاة، وسوف أبر والديَّ...)، فلا يفعل ولايبادر ولا يغتنم بل يؤجل ويسوف، فنفسه إذا حدثته بالتوبة، أو بالمحافظة على الصلاة، وغير ذلك، جاءته هذه الآفة وصرفته عن هذا الخير، ولا يزال يسوف ويؤجل حتى تفوته بركة الشباب، واغتنام وقته بالخير.**

واته: وتەکەی (هۆشیاری ئەم وتەیە بن لەمەو دوا وادەکەم ) تسویف: ئەو بەڵایەیە کە زۆرێک لەگەنجانی پێ لەناو بردووە، وەک گووتەی: هەندێکیان: (لەمەو دوا تەوبە دەکەم، پارێزگاری لە نوێژ دەکەم، لەگەڵ دایک و باوکم چاک دەبم...) نە وا دەکات و نەدەسپێشخەری دەکات نە بەدەستی دەهێنێت، بەڵکو دوای دەخات و دەڵێت لەمەو دوا وا دەکەم جا کە دەروونی خۆی هانی دەدات تەوبە بکات،

---

[1] - أخرجه ابن أبي الدنيافي كتابه (قصرالأمل) برقم (٢١٢)

یان پارێزگاری لە نوێژەکان بکات، وە جگە لەوانەش، ئەو بەڵاو نەهامەتیەی تووش دەبێت و لای دەبات لەو خێر و چاکەیە، وە هێشتا هەر دەڵێت لەمەو دوا، وا دەکەم و دوای دەخات تاوەکو بەرەکەتی گەنجی لەدەست دەچێت، وە بەدەست هێنانی کاتەکانی بەخێر و چاکەشی لە دەست دەچێت.

**وربما أجل بعضهم التوبة إلى أن يصل إلى عمر ما من حياته; فتبغته المنية قبل أن يصل إلى ذلك العمر.**

واتە: وە لەوانەیە هەندێکیشیان تەوبە کردنیان دواخست بێت تا تەمەنێکی دیاری کراو لەژیانیدا، جا مردن یەخەی پێ دەگرێت پێش ئەوەی بگاتە ئەو تەمەنەی کە دیاری کردووە.

# الوصية الخامسة عشر

# وەسیەت و ڕاسپاردەی پانزەم

**ما جاء عن حفصة بنت سيرين أنها قالت: (يامعشر الشباب، خذوا من أنفسكم و أنتم شباب فإني والله ما رأيت العمل إلا في الشباب)[1].**

واتە: ئەوەی هاتووە لە حفصة بنت سيرين ئەو گوتوویەتی: (ئەی کۆمەڵەی گەنجان، لەتەمەنی خۆتان بەدەست بهێنن لە کاتێکدا ئێوە گەنجن، جا بێ گومان سوێند بە الله کارو کردەوەم نەبینیووە تەنها لە تەمەنی گەنجان نەبێت).

**قولها: (مارأيت العمل إلا في الشباب) أي: أن مرحلة الشباب من أعظم المراحل التي هي مرحلة الخيرإن وفق الشاب بإذن الله (سبحانه و تعالى) لاغتنامها، بينما إذا لهى عن اغتنام مرحلته، واستهلك وقت شبابه في تتبع الملاذ والشهوات و مآرب النفس وحظوظها، ولا سيما المحرمات. والعياذ بالله، واستعذبها فقد جنى على شبابه ومستقبله.**

واتە: مەبەست لە وتەکەی: (هیچ کردەوەیەکم نەبینیووە تەنها لە تەمەنی گەنجان نەبێت) واتە: قۆناغی گەنجان لە گەورەترین قۆناغەکانە لە قۆناغی خێر و چاکە ئەگەر گەنج تێیدا سەرکەوتوو بوو بەویستی الله تعالى بۆ بە هەلزانینی و بەدەست هێنانی، لە کاتێکدا ئەگەر بێ ئاگا بوو بە هەلی نەزانینی و قۆناغەکەی بە دەست نەهێنا، وە کاتی گەنجی بەفیڕۆدا بەشوێنکەوتنی تام وچێژەکان وە حەز و ئارەزووەکان و داواکاریەکان و ئاواتەکانی نەفس، جگە لە قەدەغە کراوەکانیش_

---

[1] - أخرجه المروزي رحمه الله في (مختصر قيام الليل) ص: (٤٩)



پەنا بەاللّه_ وە ئەوەی دڵی پێی خۆش بوو، جا بە دڵنیاییەوە تاوانی ئەنجامداوە بەرامبەر گەنجایەتی و داهاتووی خۆی.

**كما قال القائل:**

**مآرب كانت في الشباب لأهلها عذابا فصارت في المشيب عذابا**

وەک چۆن قسە بێژێک گوتوویەتی: حەز و داخوازیەکان مایەی خۆشی بوو بۆ خاوەنەکەی لە کاتی گەنجی بەڵام لە کاتی بەساڵاچوون پیربوونیشدا بووە سزا بەسەریەوە.

**فالمآرب كانت في الشباب عذابا ويراها فاعلها حلوة، فلما كبر في السن وجدها عذابا عليه، وذلك بسبب ما ترتب عليها من العو اقب الوخيمة.**

حەزو داخوازیەکان لە گەنجیدا مایەی دڵخۆشی بوو ئەنجامدەرەکەی بە شیرینی دەی بینێت ئینجا کە گەیشتە تەمەنی بە ساڵاچوون پیر بوونیش دەبینێ بۆتە سزا بەسەریەوە، وە ئەوەش بە هۆی کۆمەڵە دەرەنجامێکی پوچ و ترسناکە کەڵەکەی کردووە کەوتووەتە ئەستۆی.

**فالشباب مرحلة عظيمة جدا في حياة المرء، ينبغي عليه أن يحسن اغتنامها، وأن يجاهد نفسه مجاهدة تامة على عدم تفويت خيرها وبركتها، مستعينا بالله (عزوجل)، طالبا مدة وعونه وتوفيقه، وأن يذكر نفسه بأن الله (سبحانه و تعالى) سائله عن هذه المرحلة سؤالا عظيما يوم يلقاه.**





ئینجا گەنجی قۆناغێکی زۆر گەورەیە لە ژیانی مرۆڤ، ئینجا پێویستە بە دەسهێنان و بەهەلزانینی چاک بکات، وە دەبێت تێکۆشانی نەفسی خۆی بکات بە تێکۆشانێکی تەواوەتی بۆ ئەوەی خێر و بەرەکەتەکەی لەدەست نەچێت، داوای یارمەتی لە اللە عزوجل بکات، داوای پشتگیری و هاوکاری و سەرکەوتن لە اللە بکات، وە بەیادی خۆی بهێنێتەوە کە اللە عزوجل پرسیاری لێ دەکات بە پرسیارێکی تایبەتی لە بارەی ئەم تەمەنە لەو ڕۆژەی کە دەگاتە دیداری .

**هذا ما تيسر جمعه في هذا الباب، وأسأل الله الكريم رب العرش العظيم بأسمائه الحسنى وصفاته العليا أن يوفقنا لما يحبه ويرضاه من سديد الأقوال وصالح الأعمال، وأن يصلح لنا شأننا كله، وألا يكلنا إلى أنفسنا طرفة عين، وأن يهدينا إليه صراطا مستقيما، وصلى الله على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين.**

ئەو پوختەیەی توانیمان کۆی بکەینەوە لەو بارەیەوە، داوا لە اللّەی کریم پەروەدرگاری عەرشی مەزن دەکەم بەناو و سیفاتە بەرزەکانی کە سەرکەوتوومان بکات لەوەی کە پێی خۆشەو پێی ڕازیە لە ڕاستی گوفتارو وە کار و کردەوە چاکەکانمان، وە گشت کاروبارەکانمان بە چاک بۆ بگێڕێت، وە بە ئەندازەی چاو تروکاندنێکیش خۆمان نەداتە دەست خۆمان، وە بەردەوام ڕێنموونیمان بفەرمووێت بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە، درود و سەلامی اللە لەسەر پێغەمبەرمان محمد بێت ، وە لەسەر خانەوادە و ئالوبەیتی و گشت هاوەڵەکانی .

والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين





# پێڕست